


ئەکادیمیای مێگامایند پڵەس
پەروەردە-ڕاهێنان-ڕاوێژکاریی

# وانەکانی ژیان 333



نوسینی
هیمداد عبدالقهار محمد

چاپی یەکەم
٢٠١٩

-ئەوانەی بەردەوام ڕوو لە کاری مرۆڤانەن.
-ئەوانەی تەنها بۆ خۆیان ناژین.

-هاوڕێو هاوپیشەکانم بۆ هاندانی بەردەوامیان.
-ئەوانەی لە پێداچوونەوەو هەڵەچنی هاوکار بوون.

مرۆڤیش لە ماوەی ژیانـدا بە چەند قۆناغێك گـوزەر دەكاتو تووشی هەڵوێستو بارودۆخی هەمەجۆر دەبێت، لەبەرئەوەی مرۆڤ بوونەوەرێكی كۆمەڵایەتییە؛ بۆیە حەز دەكات زۆربەی كات لەگەڵ كەسـانی تردا لە پەیوەندیدا بێت، ئەو حەزەی مرۆڤیش ڕەنگە بۆ خۆسەپاندن، خودسەلماندن یان فێربوون بێت!

ڕەنگە لاتان سـەیر بێت كە دەڵێم 'خۆسەپاندن'، بەڵێ بەڕاستمە، كەسـانێك هەن حەز دەكەن بۆچوونەكانی خۆیان بەسـەر كەسـانی دەوروبەریـان بسـەپێننو هەرگیـز گـوێ بـە ڕاسـتیو درووسـتی بۆچوونەكانیـان نـادەنو گوێش لە كەسـانی تر ڕاناگـرن! هەندێك مرۆڤـی تـر دەیانەوێ لـە ڕێگـەی پەیوەندی لەگەڵ كەسـانی تردا خودسـەلماندنی خۆیان بەدەسـت بهێنن یان پیشـانی كەسانی تری بدەن.

لە لایەكی تریشـەوە، مرۆڤ هەیە دەیەوێ بەردەوام فێر بێت لە كەسانی ترو ئەزموونەكانیان لە ژیاندا؛ بۆئەوەی ئەو پەندو وانەو سترتیژییانە فێر بن كە كاریگەریی ڕاستەوخۆی یان ناڕاستەوخۆی ئەرێنیان هەبووە لەسەر شێوازو ئاستی ژیانیان.

ژیانـی هەر كەسـێك یەكسـانە بـەو ئەزمـوونو دەسـتكەوتانەی بەرهەمـی زەحمەتـیو ڕەنجو ئـازارو شـەونخوونیو ماندووبوونو نیگەرانـیو دڵەڕاوكێـیو سـەرنەكەوتنو گـەڕانو تاقیكردنـەوەی جۆراوجۆرو مامەڵەكردنو ناسینی كەسانی تر.

هەر کەسێك لە ژیانیدا بە چەندین قۆناغ تێپەڕ دەبێتو تێیاندا تووشی هەورازو نشێوو چاڵو دۆڵو تەنانەت خەرەندو تەلان دەبێت، کە هەر یەکێکیان وەك وانەیەکی گرنگن بۆ ژیانی ئەو کەسە؛ بۆیە ئەگەر کەسێك بیەوێ ئەو وانانەی ژیانی خۆی بە شێوەیەك لە شێوەکان بخاتە ڕوو؛ ئەوا بە دڵنیاییەوە کەسانی تر سوودی لێ دەبینن‌و دەکرێ بکرێنە مۆمو مەشخەڵ بۆ ڕووناککردنەوەی گۆشەیەکی ژیانیان؛ بۆئەوەی بتوانن ئاسانتر بەسەر هەورازەکانی ژیاندا سەرکەون‌و سەلامەتتر بە نشێوەکاندا تێپەڕن؛ تا دەگاتە ئاستی گەیشتنە مەبەستو ئامانجەکانیان لە ژیان.

ئەو وانانەی بەردەستتان ئەزموونی ساڵانی ژیانن لە چەندین بارودۆخو هەلوێستی خۆش‌و ناخۆش لە شوێن‌و پێگەی جیاوازو مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی تردا لە پۆستو پێگەی جیاوازو شیلەی بەرهەمی خوێندنەوەی جۆراجۆرو کارکردن لە پیشەی جیاوازی وەك: دەستفرۆشی‌و فرۆشیاری سەر شەقامو ڕێگاو دوکانداریی‌و وەرگێڕو نووسەرو مامۆستاو یاریزان‌و خاوەنی کۆمپانیاو ئەکادیمیاو کاروباری کارگێڕیی لە وەزارەتو زانکۆو کولێژو بەش‌و ڕێکخراوەکان.

ئامادەکردنی وانەکانی ژیان، ڕۆژ بە ڕۆژ لەگەڵ ڕووداوەکانی ڕۆژانە نوسراون‌و زۆربەی هەرە زۆریان خۆم یان کەسانی نێزیکی دەوروبەری پێیاندا تێپەڕیووین؛ بۆیە زۆر ڕاستگۆیانە لەگەڵ واقیعی کۆمەڵگای خۆمان دەگونجێن.

بۆئەوەی وانەکان سوودی زیاتریشیان هەبێت بۆ خوێنەری بەڕێز، وانــەکان بە زمانــی ئینگلیزیش خراونەتە ڕوو؛ تــا لەبارەی زمانی ئینگلیــزیو شــێوازی وەرگێڕانیــش ســوود بەوانــە بگەیەنێــت، کە ئارەزووی دەوڵەمەندترکردنی فەرهەنگی وشەی زمانی ئینگلیزینو حەز بە کاری وەرگێڕان دەکەن.

پێویســتە خوێنــەری بەڕێز ســەرنجی ئــەوە بدات، کــە لە کاتی داڕشتنی وانەکان بە زمانی کوردی زۆرجار کێشو سەروا لەبەرچاو گیــراوە، بــەڵام ئــەو تایبەتمەندییــە لــە وەرگێڕانــە ئینگلیزییەکە نەتوانراوە ئەنجام بدرێت.

وانەکانــی ژیــان بەرهەمــی ســەرنجو هــزرو ئەزموونــە خۆشو ناخۆشەکانی ژیاننو هیوادارم ببنە هۆی ڕۆشنکردنەوەی ڕێی ژیانی خوێنەرانو ڕۆڵی چاوساغو هاوڕێی ڕاستەقینە بگێڕن لە ژیانی هەر یەکێك لە ئێوەی بەڕێز.

بەهیــوای گەشــتێکی خۆش لەگــەڵ وانەکانو دڵنیابــن بەردەوام دەبین.

٢٠١٩/٠٥/٠١

وانەی ١

# بۆئەوەی گەورەتر بی لە چاوی خەڵک، ئاماژە بە گەورەیی کەسانی تر بکە!



**To** grow in the eyes of people, mention the greatness of others.

وانەی ٢

# خۆت لە پشت گەورەیی کەس مەشارەوە، تۆش مافی گەورەبوونت هەیە!



**Do not** hide behind someone else's greatness, you have the right to grow!

وانەی ٣

# گەورەیی مرۆڤ لە گەورەیی بیرکردنەوەیەتی، نەک خانووەکەی!



**Human's** greatness is in the greatness of his thinking not his house!

وانەی ٤

# خۆناسین، سەرەتای ئاسوودەییە!



**Knowing** yourself is the first step towards.

وانەی ٥

# ئەگەر هەستت کرد کەس ڕێزت ناگری؛ ئەوا گلەیی لە خۆت بکە، نەک بەختت!



**If** you felt nobody respects you, blame yourself not your luck.

٦

# ئەگەر هەناوت ڕەش بێ، پەیڤەکانت هەتا سەر سپی نابن!



٧

# له ناختدا باخێک هەیە ئاوی بده، ئەوسا بۆ خۆت لە سێبەری پشوو بده!



وانەی ٨

# نەبوونی متمانە، ڕێگرە لە داهێنان.



**Lack** of confidence hinders creativity.

وانەی ٩

**چاوەڕێی دەرفەت مەکە، بەڵکو دەرفەت بۆ خۆت دروست بکە.**



**Do** not wait for opportunity, create one for yourself.

وانەی ١٠

**لە هەناوی هەر گرفتێكدا گەڕای، سوودێكی گەورەتر هەیە، بەدوایدا بگەڕێ!**



**Within** the essence of any problem, there lies a seek of better benefit, search for it.

١١

# بۆ ئاسوودەیی، پێویستە جیهان وەک خۆی ببینین، نەک وەک ئەوەی ئێمە دەمانەوێت!



١٢

# هەرگیز یاری بە هەستە ڕاستەقینەکانی کەسانی دی مەکە، تەنانەت ئەگەر لە ڕووی ئەقڵیش کەموکورتیان هەبی!



وانەی ١٣

# تواناکانت بەسەر تەمەنتدا دابەش بکە.



**Distribute** your capabilities over your age.

١٤

# به چاوی گەشبینی تەماشای دونیا بکە، ئەویش بە گەشی خۆیت پیشان دەدا.



وانەی ١٦

# کەسایەتی مرۆڤ یەکسانە بە دونیابینیو ژیاندۆستی ئەو کەسە!



**One's** personality equals his/her vision of the world and life.

وانەی ١٧

## هێزو تواناکانت بەسەر بەهرەکانت دابەش بکە.



**Distribute** your energy and strength over your talents and skills.

١٨

مەرج نییە دەمودەست بەرهەمی
کارە چاکەکانت ببینیەوە، بەڵام
دڵنیابە لە شوێنێک دەیبینی
هەرگیز چاوەڕێت نەکرد بێت!



وانەی ١٩

# کورسی یاخود پۆست، بەها بە کەسە ڕەسەنەکان نادەن، بەڵکو کەسەکان بەها بە کورسی یاخود پۆست دەدەن!



**Posts**/responsibilities do not give value to the real people but the real people give value to the post

وانەی ٢٠

# درۆو بوختان، دوو چەکی دەستی نەزانو ترسنۆکەکانن؛ بۆیە مەیانکە بە بنەما بۆ هەڵوێستو بڕیارەکانت!



**Lies** and fabrication are two weapons of the ignorant and the cowards, never make them the basis of your stance or decisions.

وانەی ۲۱

# مەهێڵە هیچ 'هاوڕێ'یەکت قسەت بۆ بهێنێ؛ چونکە نەدەبوو ڕێگە بدات ئەو قسانە بکرێن لەبەردەمی ئەو!



**Do not** let any of your friends bring you others' speech because he should not have allowed them to talk in front of him/her.

وانەی ٢٢

# ئەگەر پێویست نەبوو بڕیار بدەی؛ ئەوا پێویستە بڕیار نەدەی!



**If** it was not necessary to decide so you should not decide.

وانەی ٢٣

# بۆئەوەی ئاسوودە بی، ڕۆژانە ماوەیەک بە تەنیا لەگەڵ خۆت بە!



**To** be happy, spend some time alone with yourself on daily basis.

وانەی ٢٤

**ژیان بەس تۆی تێدا نییە؛ بۆیە خۆت مەکە بە تەوەری هەموو شتێک!**



**Life** does not have you in it only, so do not make yourself the centre of everything.

وانەی ٢٥

# ئەگەر دەتەوێ هاوکاری کەسێک بکەی، سەرەتا پێویستە متمانەی بەدەست بهێنی؛ تا هاوکارییەکەت قبوڵ بکات!



**If** you want to help someone, first you need to win his trust in order to accept help from you!

وانەی ٢٦

**ڕاستییەکان هەرگیز درۆ ناکەن؛ بۆیە بەدوایدا بگەڕێ؛ تا ئەویش بەدواتدا بگەڕێ!**



**Truths** never lie, thus search for it so that it also searches for you.

وانەی ٢٧

# سەرکەوتن چەند گرنگە، هەنگاوەکانی دوای سەرکەوتن هێندەیتر گرنگن!



**Success** is important , the steps after success are more important

وانەی ٢٨

# هەوڵ بدە ببە ئاوێنە بۆ هاوڕێیەکانت.



**Try** to become a mirror for your friends

٢٩

# هونەری گوێگرتن(گوێگرتن لە خۆتو خەڵکو سرووشت)، لە هەموو هونەرەکانی تر گرنگترە بۆ ژیانێکی ئاسوودە.



وانەی ٣٠

# ئەوانەی هی خۆتن، دەستیان پێوە بگرە، نەک ئەوانەی دەتەوێ بۆ خۆت بن!



**First** catch those that are yours not those you want to be yours!

وانەی ٣١

# لەسەر دەرفەتی چاکەکردن پاز مەدە؛ چونکە چاکەکردن بە هەموو کەس و لە هەموو کاتێک ناکرێت!



**Never** skip any chance to do good because doing good cannot be done by everyone and not at every time!

وانەی ٣٢

# هەستکردن بە بەرامبەر (کەسەکان و بوونەوەرەکان و سرووشت)، ئەوپەڕی تێگەیشتن و پێگەیشتنی مرۆڤەکانە.



**Feeling** others (people, other creatures and the nature) is the utmost degree of understanding and maturity of human beings.

وانەی ٣٣

## لەخۆباییبوون دوژمنی سەرسەختتی مرۆڤبوونە.



**Arrogance** is the utmost enemy of being human.

وانەی ٣٤

**بۆئەوەی سەرکەوتوو بی، پێویستە ئامانجەکانت دیاری بکەی‌و کاربکەی بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە(باشترە ئامانجەکانت بە نووسین لەبەردەست بی).**



**To** succeed you need to identify your objectives and work for achieving them (It is better to have the objectives in writing available).

وانەی ٣٥

## ئاگادار بە! هیواو خەونو خۆزگە جیاوازن لە ئامانج. (بۆئەوەی سەرکەوتوو بی، دەبی جیاوازی نێوانیان بزانی)!



**Be** aware, hopes ,dreams and wishes are different from objectives. To succeed, you need to know the difference between them.

وانەی ٣٦

**ئارامگرتن کلیلە بۆ چارەسەری زۆربەی گرفتەکان، بەڵام زوو بڕیارنەدانو کاردانەوەی ژیرانەش دەتگەیەنێتە هەمان ئامانج.**



**Patience** is key to the solution of most of the problems but not taking quick decisions and smart reactions will take you to the same objective.

وانەی ٣٧

**ئەگەر خاڵێکی لاوازت لە هاوڕێیەکت بینی، هەوڵ بدە چاکی بکە نەک ئیستغلال!**



**If** you found a vulnerable point in one of your friends try to fix it not use it!

وانەی ۳۸

# شەرمكردن لە ویژدانی خۆت، ئەوپەڕی تێگەیشتنە!



**Feeling** shy of your conscience is the utmost level of understanding.

وانەی ٣٩

**چاوەڕێی خراپترین سیناریۆ بکە لە ژیان، بەڵام بۆ باشترینیان هەوڵ بدە.**



**Expect** the worst scenario in your life but work for the best.

وانەی ٤٠

# هەوڵ بدە لە گۆشەنیگای جیاواز لە کێشەکان بنواڕی؛ بۆئەوەی کاردانەوەت گونجاوو کاریگەر بێت.



**Try** to look at the problems from difference perspectives so that your reactions are appropriate and effective.

وانەی ٤١

# ئەوەی ناخی پاک بێت، تیشکەکانی چاوی و پەیڤەکانی زاریشی پاک دەبن!



**The** one whose essence is pure , the rays of his eyes and words of his mouth will be pure as well.

وانەی ٤٢

**مادەم ڕێگا هەیە، پێویستە بەدوای ئیرادە بگەڕێی؛ بۆئەوەی ئامانجەکانت بپێکی.**



**Since** there is way, we need to look for will to achieve our objectives.

وانەی ٤٣

**هەرگیز شانازی بە یاساشکاندن مەکە؛ چونکە ڕەنگە تۆ نموونە بی بۆ چەند کەسێک!**



**Never** boast for breaking the laws because you might be the role model of so many.

# 333

٤٤

**لەبەرخاتری کەس خۆت مەدۆڕێنەو خۆت سووک مەکە؛ چونکە هەر ئەو کەسانە وەک دۆڕاوو سووک باست دەکەن!**



وانەی ٤٥

# ئەو کەسانەی بێ شایستەبوون دەسەڵاتیان دەکەوێتە دەست، ڕەشێتی ناخیان بە بڕیارەکانیان ئاشکرا دەبێ!



**Those** who undeservedly get to posts, the blackness of their essence will be revealed by their decisions.

وانەی ٤٦

# کەسێک ئارەقەی بۆ نانی ژیانی کرد بێ، زیاتر جێگەی متمانەو وەفایە!



**The** one who has sweated for his living is more trustworthy and sincere.

وانەی ٤٧

# نرخ بۆ هەموو شتێک دامەنێ؛ چونکە دونیا بەس پارە نییە!



**Do not** put price for everything because the world is not only money.

٤٨

# ئەوانەی لە کەرتی پەروەردەو فێرکردن کار دەکەن، پێویستە بەلایەنی کەم مرۆڤ بن؛ بۆئەوەی سەرکەوتوو بن!



وانەی ٥٠

# ئەوەی بە ڕێزگرتن‌و ڕێزنیشاندان ئەنجام دەدرێ، زۆر لەوە کاریگەرترە کە بە هۆی ترس‌و دەسەڵات دەکرێت!



**What** can be done through respecting and showing respect to others is more effective than what is done through fear and authority.

وانەی ٥١

**مرۆڤی ڕەسەن خۆی ناهێنێتە ئاستی هەموو کەسێک؛ بۆیە زۆرجار بێدەنگی هەڵدەبژێرێت، نەک هاتنەدەنگ بەرامبەر دیوار!**



**Genuine** humans do not bring themselves to the level of everyone, so he keeps silent instead of talking to a wall!

وانەی ٥٢

**هێندەی خەریکی خۆنێزیککردنەوەی لە خەڵکی بە دەسەڵات، خەریکی خۆنێزیککردنەوە بە لە ناخی خۆت.**



**Instead of** getting closer to the people with authority, busy yourself with getting closer to your essence.

وانەی ٥٣

**مرۆڤەکان جیاوازن، بەڵام بەهای مرۆڤبوون کۆماندەکاتەوە؛ بۆیە ڕەچاوی ئەو خاڵە بکە لە کاتی مامەڵەکردندا.**



**Humans** are different, but humanity unites us, hence take this into consideration when you treat people.

وانەی ٥٤

**هەموو کاتێک هێمنیو ئارامبوون بەسەر هاتوهاوارو هەڵەشەیی سەردەکەوێت، تەنانەت ئەگەر درەنگیش بێت.**



**Being** calm and patient always wins over shouting and impatience even if it comes late.

وانەی ٥٥

**بۆئەوەی سەربەرز بی، مەرج نییە لە هەموو کارێک براوە بیت!**



**In order** to keep your head high it is not a condition to win all the time!

وانەی ٥٦

**زۆربەی کات مرۆڤەکان ئەو لایەنانە دەبینن، کە خۆیان باوەڕیان پێی هەیە، نەک باوەڕ بەو لایەنانە بکەن کە دەیبینن!**



**Most** of the time, humans see what they believe not believe what they see.

٥٧

**خۆت لە هەموو کەس باشتر خۆت دەناسیو دەزانی بایی چەندیو شایستەی چی؛ بۆیە پێویست ناکا نە خۆتو نە خەڵک هەڵبخەڵەتێنی؛ چونکە ڕاستییەکان لە پڕ دەردەکەون.**



وانەی ٥٨

# دونیای هەر کەسێک یەکسانە بە ناخی ئەو کەسە؛ بۆیە گلەیی لە کەس مەکە!



**Your** world equals your essence so do not blame anyone!

وانەی ٥٩

**نە زوو بڕیاردە نە درەنگ؛ چونکە زوو بڕیاردان تووشی هەڵەت دەکاتو درەنگ بڕیاردانیش دەرفەتت لە کیس دەبات!**



**Neither** take decisions soon nor late because taking quick decisions will lead to mistakes and taking late decisions will make you miss opportunities.

وانەی ٦٠

# هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتیو لێبوردن، کلیلی بیرکردنەوەی ئەرێنین، کە بەرەو ئاسوودەییو سەرکەوتنت دەبات!



**Taking** responsibilities and tolerance are key to positive thinking that takes you to peace of mind and success.

وانەی ٦١

**گومان بە گشتیو بەدگومانی بەتایبەتی، دوژمنی سەرسەختی بیرکردنەوەی داهێنەرانەن!**



**Suspicion** in general, ill-suspicion in particular are the enemies of creative thinking.

وانەی ٦٢

**بۆئەوەی سەرکەوتوو بی، پێویستە لە ئیدارەدانی کاتو تواناکانت دەست پێ بکەی.**



**In order** to be successful you have to start from your time and ability management.

وانەی ٦٣

**سەرکەوتنی پەروەردەکار کاتێک دەست پێ دەکات، کە خۆی نموونەیەکی باش بی بۆ پێشەنگبوون.**



**The** success of educationalists starts when he is a good sample for becoming a model.

وانەی ٦٤

**ئەگەر دەتەوێت گۆڕانکاری بکەی لە ژیانت، ئەو کاتە بیکە کە دەتوانی، نەک ئەو کاتەی کە ناچاری.**



**If** you want to make changes in your life , do it when you can, not when you are obliged to.

وانەی ٦٥

# لەنێوان ڕەزامەندیی ناخی خۆتو ڕەزامەندیی خەڵکی دەوروبەرت، ڕەزامەندیی ناخ هەڵبژێرە.



**If** you had to choose between the acceptance of your essence and people around you, choose the first.

وانەی ٦٦

**هەڵەكردن لە كاركردندا، زۆر باشترە لە هەڵەنەكردن لە كارنەكردندا!**



**To** make mistakes while you work is better than not making a mistake while you do not work!

وانەی ٦٧

**لە بیرت بێ، خەڵک هەڵەکانت دەبینن، بەڵام پەشیمان بوونەوەکانت نابینن؛ بۆیە هەوڵ بدە کەمترین هەڵە بکەیت؛ تا کەمترین پەشیمان بوونەوەت هەبێ!**



**Remember** people see your mistakes but not your regrets, so try to do the least mistake to have the least regrets.

وانەی ٦٨

**هەندێک کەس بەردەوام هەوڵ دەدەن ڕۆشنایی کەسایەتی تۆ داپۆشن، بەڵام دڵنیا بن ڕۆشنایی ڕاستەقینە هەرگیز ون نابێ!**



**Some** people continuously try to cover the light of your personality but be sure true light can never be covered.

وانەی ٦٩

**شێوازی قسەکردنتو زمانی جەستەت بە بێ ویستی خۆت ڕەنگدانەوەی ناخی تۆن؛ بۆیە دەبێ لەگەڵ یەکتر تەبا بن، ئەگینا متمانە لەدەست دەدەیت!**



**Your** style of talking and body language unwillingly reflect your essence, therefore they need to match otherwise you will lose trust.

وانەی ٧٠

# مەرج نییە بڕیارو هەستەکانی یەکەم نیگا، هەموو کات درووست بن!



**It** is not a condition for the first decision and first feelings to be always true!

وانەی ٧١

# بێهیوا مەبە لە هاوڕێیەکانت کاتێک لە یەک خاڵدا لەگەڵت جیاواز دەبن؛ چونکە ڕەنگە پاساوی خۆیان هەبێت!



**Do not** get disappointed at your friends when they think differently with you in one point because they might have their own justification.

وانەی ٧٢

## هەرگیز هاوڕێیەتی تێکەڵ بە کار مەکەو لەسەر ئەو بنەمایە بڕیار مەدە!



**Never** mix friendship with work and do not make decisions on this basis.

وانەی ٧٣

# ژیان تەنها ڕەش یان سپی نییە! ئەو کەسەی بە ڕەش یان سپی دونیا دەبینی،لە بیرکردنەوەدا هەژارە!



**Life** is not only black or white...the one who sees the world as black or white is poor in thinking.

وانەی ٧٤

# کێشەی مرۆڤی ئەو سەردەمە ئەوەیە: بەدوای چارەسەر دەگەڕێت بۆ کێشەیەک، هێشتا درووستی نەکردووە!



**The** problem of today's people is that they are searching for solution of a problem he has not created yet!

وانەی ٧٥

**(خۆزگە) بە تەنها بریتی نییە لە ستراتیژ، بەڵکو هاوکێشەیەکە بۆ کارەسات!**



**Wish** is not only a strategy but a formula of disaster!

وانەی ٧٦

**هەر کەسێک زاخی خۆی هەیە؛ بۆیە ناتوانی بە زاخی کەسێکی دی کار بکەیو چاوەڕێی ئەنجامی باش بکەی!**



**Everyone** has his prestige, so you cannot depend on others' prestige and expect good results.

وانەی ٧٧

# لاساییکردنەوە بە تەنها بەس نییە، ئەگەر ئیزافەی خۆتی لەگەڵ نەبێت.



**Imitation** is not enough if you do not have your additions!

وانەی ٧٨

## سەرکەوتن گرنگە، بەڵام لەویش گرنگتر، شێوازی گەیشتن بە سەرکەوتن!



**Success** is important but what is more important is the way you achieve it!

٧٩

**وەک چۆن شووشەی بۆن، دوای تەواوبوونی شلەی بۆنەکەی هێشتا بۆنی هەیە، بە هەمان شێوە یادگارییەکانی ژیانیش!**



## 333

٨٠

مرۆڤ هێندە بەدوای فریشتەبوونی خۆیدا دەگەڕێ؛ تا ئەو ڕادەی شەیتانبوونی کەسانی دی، بە سەرکەوتنی خۆی دەزانێت.



٨١

ئەگەر متمانەت بە خۆتو
نیەتەکانت هەیە، بەردەوام بە
لەسەر کارکردنت؛ چونکە خۆت لە
هەموو کەس باشتر خۆت دەناسی!



٨٢

# کەسێک بە خۆی لەگەڵ فرمێسکەکاندا گەورە بوو بێت، هەرگیز پێکەنینی بە فرمێسکی کەسانی دی نایێت!



٨٣

# له بیر مەکە، ئەگەر فێڵ له کەسێک بکەیت، یەکەم جار فێڵت له ویژدانو کەسایەتی خۆتو پاشان ناپاکیت له متمانەکەیان کردووە!



٨٤

له هەر شوێنو پێگەیەک کار بکەی،
لە بیرت بێت دوو شت زۆر گرنگن:
چی له دوای خۆت بەجێدێڵیتو چی
لەگەڵ خۆت دەبەیت!



وانەی ٨٥

## ئەگەر بتەوێ فیلێک بخۆی، دەبی پاروو پاروو بیخۆی!



**If** you want to eat up an elephant, you have to do it bite by bite!

٨٦

**ئەگەر داوات لێ کرا زەڕافەیەک بخەیتە ناو بەفرگرێک، سەرەتا لە بوونی زەڕافەو بەفرگرەکە دڵنیابەوە، پاشان هەوڵ بدە!**



٨٧

# گورگ لە پێستی مەڕیش بی، ڕەفتارەکانی گورگانەیە؛ بۆیە بە چاوی ئەقڵ ڕەفتارەکان هەڵبسەنگێنە!



وانەی ٨٨

**بۆ ئەوەی ئاسوودە بی، بۆ سەرکەوتن کار بکە، نەک بۆ دەرکەوتن!**



**To** be happy, work for success not showing off!

وانەی ٨٩

# بۆئەوەی باوەڕت پێ بکرێت، پێویستە زمانی جەستەو پەیامەکەت تەبا بن!



**In order** to be believed, your body language should match your message!

وانەی ٩٠

# کاریزمابوون لە ناخی خۆتدایە، لە دەرەوەی بەدوایدا مەگەڕێ!



**Being** charismatic is within you, do not search for it outside.

وانەی ٩١

# بۆئەوەی ئاسوودە بی، وانەیەک لە هەڵوەرینی گەڵاکان فێر بە!



**To** be happy, take a lesson from fading of leafs!

وانەی ٩٢

# بۆئەوەی ئاسوودە بی، لەنێوان چاوی عەقڵو عەقڵی چاو، یەکەمیان هەڵبژێرە!



**To** be happy, between the mind's eye and eye's mind, choose the first!

وانەی ٩٣

**بۆئەوەی ئاسوودە بی، ڕێگە بە خۆت مەدە یاری بە هەستو سۆزو چارەنووسی کەس بکەیت!**



**To** be happy, do not allow yourself to play with others' feelings, emotions and destiny!

وانەی ٩٤

# سەنگین بە نەک زەنگین.



**Be** of value not rich!

وانەی ٩٥

# پرد بە نەک گرد.



**Be** a bridge not a hill.

وانەی ٩٦

# مەرد بە نەک دەرد.



**Be** a man not a disease.

وانەی ٩٧

# دوگمەی بەختەوەری خۆت مەدە دەست کەسێکی دی!



**Do not** hand in the button of your happiness to someone else!

وانەی ٩٨

# سنوور بۆ فێربوون دامەنێ، بەڵکو بۆ تێربوون!



**Do not** set limits for learning but for saturation!

333

٩٩

# مەرج نییە هەموو کات جەستەی ڕێک ئەقڵێکی جوانی تێدا بێت، بەڵام هەموو ئەقڵێکی جوان جەستەیەکی ڕێکت پێ دەبەخشێت!



وانەی ١٠٠

# دڵێکی گەورەت دەوێ؛ بۆئەوەی مێشکە بچووکەکان تێبگەیەنیت!



**You** need a big heart to make small minds understand!

١٠١

# خوێندەواریو توانای خوێندنەوە دوو شتی جیاوازن، تێکەڵیان مەکە!



وانەی ١٠٢

# پەروەردەکردنی منداڵێک، ئاسانترە لە چاککردنی هەرزەکارێک!



**Educating** a child is easier then rectifying an adult!

وانەی ١٠٣

**کانیاوی هەستە پاکەکان، لە ناخی مرۆڤەکاندایە، پێویست ناکا لە دەرەوە بەدوایدا بگەڕێی!**



**The** spring of pure feelings are within the human beings, there is no need to search for it outside!

# 333

١٠٤

هیچ کەسێک لە ژیان ڕەش مەکەوە؛ چونکە مرۆڤ دەبی وانە لە باش‌و خراپ وەربگری!



وانەی ١٠٥

# ئەگەر پێڵاوەکەت بۆ پێیەکانت تەنگ بوو؛ ئەوا هەڵەی خۆتە، نەک هەڵەی پێڵاوو پێیەکانت!



**If** your shoes did not fit your feet, it is your fault not the fault of your shoes or your feet!

وانەی ١٠٦

# ئاگادار بە، یەک دڵۆپ گومانی ڕەش دەبێتە هۆی تەڵخکردنی ناخی سپیت!



**Be** aware, one drop of black suspicion will lead to blurring your white essence!

وانەی ١٠٧

# بەخشین بکە دروشم، ڕێگات دەبێتە ئاوریشم!



**Make** donation and giving your motto, your way will be silk-filled

وانەی ١٠٨

# فامی مافەکانی خۆت بکە!



# Comprehend
your rights!

وانەی ١٠٩

# ئەگەر کاتت نەبوو بۆ کتێب خوێندنەوە؛ ئەوا بە لایەنی خۆت بخوێنەوە!



**If** you did not have time to read books, at least read yourself.

وانەی ١١٠

# ڕێگە مەدە خۆشییە کاتییەکانی ژیان، بەلاڕێتدا ببات!



**Do not** let temporary joys of life divert you!

وانەی ١١١

# توانای شاراوە لە ناخی هەموو کەسێکدا هەیە...سەرکەوتووەکان ئەوانەن سوودیان لەو توانا شاراوانەی ناخیان وەرگرتووە!



**There** are hidden capabilities within everyone... successful people are those who make use of these hidden capabilities.

وانەی ١١٢

# بێئومێد مەبە کاتێک شتێکت دەست ناکەوێ، کە هەوڵی بۆ دەدەی؛ چونکە لەوانەیە باشتر چاوەڕێت بکات!

**Do not** get disappointed when you do not achieve what you try to get because what waits you might be better!

وانەی ١١٣

**نابێت ویستەکانی خۆت، لە بەدەستهێنانی دڵی تەنها کەسێک چڕ بکەیەوە!**



**One** should not gather all his wishes and desires in gaining one person’s heart!

وانەی ١١٤

# ژیان لە پێناو خودا ئاسانترە لە مردن لە پێناوی!



**Living** for God is easier than dying for Him!

وانەی ١١٥

**هەموو کەسێک داهێنەرە، بەس دەبی باوەڕی بە خۆی هەبیو کاری لەسەر بکات.**



**Everyone** is creative but he/she should believe in himself/herself and work on it!

١١٦

# بەردەوام هەوڵی فێربوون بدە؛ چونکە کاتێک پێویستت بە بەهرەیەک دەبی، کاتی فێربوونت کەم دەبێت!



وانەی ١١٧

**لە بیرت بێت، تۆ ئاوێنەی دایکتو باوکتی؛ بۆیە کارێک مەکە شەرمەزار بن!**



**Remember** you are a mirror of your father and mother, do not do anything to embarrass them.

وانەی ١١٨

## نە ناو باشە نە باو؛ بۆیە بە دوای ناواخنو ناباودا بگەڕێ!



**Neither** fame nor what is common are good, therefore search for what is within and what is not common!

وانەی ١١٩

# بەدوای سەرکەوتنێک مەگەڕێ لەسەر شکستی ئەوانی تر بێت!



**Do not** search for a success which is based on the failure of others!

وانەی ١٢٠

**هەرگیز خۆت بۆ کەسێک بچووک مەکەوە، کە خۆی بە گەورە دەزانێ!**



**Never** belittle yourself for someone who sees himself as higher.

وانەی ۱۲۱

# خۆبەراوردکردن بە کەسانی دی، دوژمنی خۆشییەکانتە!



**Comparing** yourself to others is the enemy of your happiness!

وانەی ١٢٢

# ئەگەر نەتوانی چاکە لەگەڵ خۆتدا بکەیت، چاوەڕێ مەبە بتوانی لەگەڵ خەڵکدا بیکەیت!



**If** you cannot do favours with yourself ,do not wait to be able to do so with others!

وانەی ١٢٣

# تێکۆشانی خۆت بکەو هەقت لەسەر تێکوشینی خەڵک نەبی!



**Make** best of what you can, let other people fabrication about you behind!

وانەی ١٢٤

# چەشنی لاولاو خۆت لە ئامانجەکانت بئاڵێنە؛ تا دێنەدی.



**Round** yourself on your goals!

وانەی ١٢٥

**لە بیرت بێ، دیدی تۆ بۆ چاوی من ناشێت! (مەرج نییە من وەکو تۆ شتەکان ببینم)**



**Remember**, your perspective does not fit my eyes (it is not a condition for me to see things like you)!

وانەی ١٢٦

# بەڕێوەبردنی کات زۆر گرنگە، بەڵام ئێستا باوی بەڕێوەبردنی سێرەگرتنە (تەرکیزکردنە).



**Time** management is very important but now it is time for focus-management

وانەی ١٢٧

## لە ژیاندا زۆرجار درۆو بوختان بۆ ماوەیەکی کاتی لەسەر عەرشی ڕاستی خۆیان دەنوێنن، بەس هەر ڕاستی سەردەکەوێت!



**In** life, lies and fabrications often show themselves on the throne of truth for a temporary time but truth always wins!

وانەی ١٢٨

# لە بیرت بێ، دەستکەوتی مەعنەوی‌و هەمیشەیی، زۆر گرنگترن لە دەستکەوتی ماددی‌و کاتیی!



**Remember** moral and long-term achievements are more important than materialistic and temporary ones!

١٢٩

**پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان (کە لەسەر بەرژەوەندی، بونیاد نەبوو بێت) سەرمایەو سامانن بۆ مرۆڤ؛ بۆیە تا پێت دەکرێت بە پارە مەیگۆڕەوە!**



وانەی ١٣٠

**تا ئاسوودە بی، دڵو دەروونت هێندەی ئاسمانەکان بەرزو فراوان بکە؛ بۆئەوەی هەموو خەمە بەرزو فراوانەکانیش جێیان ببێتەوە!**



**To** be happy, make your heart and mind as high and as wide as the sky to be able to embrace high and wide grieves!

وانەی ١٣١

**ئەگەر دەتەوێ کەس خۆی لە ئیش‌و کارت هەڵنەقورتێنی، لە خۆترا دەست پێ بکە!**



**If** you do not want anyone to interfere in your business, start from yourself!

وانەی ١٣٢

# جیاوازی نێوان خەون و ڕاستی وشەیەکە لە سێ پیت پێکدێت (ک ، ا ، ر ).



**The** difference between dream and reality is one word (WORKING)!

وانەی ١٣٣

**لە بیرت بێ، پێویستیت بە هیچ هۆکارێک نییە؛ بۆئەوەی یارمەتی خەڵک بدەی.**



**Remember**, you do not need any reason to help other people!

وانەی ١٣٤

# هەوڵ بدە پاڵەوانێکی نادیار بی، نەک نمایشکارێک!



**Try** to be a hidden hero not a public performer!

وانەی ١٣٥

# لە پشت هەر خەمێک، غەدرێک هەیە، خەمڕەوێنی بکە دروشم نەک غەدر!



**Behind** every grief there is injustice, make grief-relieving your motto not injustice!

وانەی ١٣٦

# پڵنگێکی بریندار بی، باشترە لە ڕێوییەکی ساغو سەلامەت!



**To** be a wounded tiger is better than being a safe fox!

وانەی ١٣٧

**هێندە ئازاری خۆت مەدە**
**لەبەر هەڵەی کەسانی تر؛**
**چونکە ئەوان ڕەنگە لە ئەسڵدا**
**مەبەستیان ئازاردانی تۆ بێت!**



**Do not** hurt yourself so much because of others' mistakes because they might have originally intended to hurt you!

وانەی ١٣٨

# 'پیاوەتی' خۆت مەدە دەست کەسانی دی!



**If** you are able to do a favour for someone, do it yourself and do not let someone else ask you to do that!

وانەی ١٣٩

# خۆت لە هەموو کەسێک گرنگتری؛ بۆیە تەندروستیی خۆت مەکە قوربانی ڕقو ئیرەیی کەسانی دی!



**You** are more important than others so do not sacrifice your health to hatred and jealousy.

وانەی ١٤٠

# ژیان کورتە؛ بۆیە هەرچی زووە خۆت لە کەسانی نێگەتیڤو هەڵە دووربکەوە!



**Life** is short, so move away from negative and wrong people!

وانەی ١٤١

**وا تێنەگەی بە تەنها هیچت پێ ناکرێ؛ چونکە دڵنیابە زۆر کەس تۆ وەک پێشەنگو نموونەی باڵا دەبینن.**



**Do not** think that you are not able to do anything alone because certainly there are many people who look at you as their role model!

وانەی ١٤٢

# ناتوانی ئامانجێک بپێکی، کە نایبینی؛ بۆیە ئامانجەکانت بکە نووسینو وێنە؛ تا بەردەوام بیانبینی.



**You** cannot achieve a goal that you cannot see, therefore put your goals in writing and draw them to see them continuously.

وانەی ١٤٣

# تەنها بۆ گەیشتن بە بەهەشت چاکە مەکە؛ چونکە مەرج نییە هەموو شتێک بەرامبەری هەبێت!



**Do not** do favours only to go to heaven because it is not a condition for everything to have something in return!

١٤٤

**له خۆبایی مەبەو لاف بەسەر کەسدا لێ مەدە؛ چونکە دوو پەتانو لە مرۆڤبوون دوورت دەخەنەوە!**



## ئەگەر دەتەوێ ئاسوودە بی، دەبی لەگەڵ ویژدانی خۆتدا دادپەروەر بی!



وانەی ١٤٦

**لە ژیاندا زۆرجار دەبینی کەسێک لە ناکاو دەگۆڕێ...ئەوە گۆڕان نییە، بەڵکو دەرکەوتنی گەوهەری ڕاستەقینەی ئەو کەسەیە، کە تۆ پێشتر بە هۆی خۆشەویستیو ڕێزگرتن نەتبینیوە!**



**In** life, you often see someone suddenly changes! This is not sudden change but the appearance of the real essence of the person that you could not see his reality because of love and respect!

وانەی ١٤٧

**باشترین بەڵگە بۆ درووستی پەیوەندییەکان، بریتییە لە تەرخانکردنی کاتو بەخشینی خۆشەویستی بێمەرج... هەر کەسێک ئەو دووەی پێ دایت، لە دەستی مەدە!**



**The** best evidences of good relations are time allocation and unconditional love... if someone gave you these two ,try not to lose him/her.

وانەی ١٤٨

**هەرچەند سادەو ڕێزگر بی، ئەوا ئاڵۆزیی دێتە ڕێت، بەڵام تۆ هەر بەردەوام بە؛ چونکە سادەیی و ڕێزگرتن دوو کۆڵەگەی مرۆڤبوونن.**



**The** more you are modest and respecting others, the more difficulties will face you. But go on because modesty and respect are two pillars of being human.

# 333

١٤٩

## خۆبەزلزانین بەهۆی پلەو پۆستی کاتیی، خۆدۆڕاندنی درێژخایەنی بەدوادا دێت!



وانەی ١٥٠

# ڕق ژەهرە، مەهێڵە توخنی دڵت كەوێ؛ چونكە كە تێكەڵی خوێنت بوو، ناتوانی لێكیان جیاكەیەوە!



**Hatred** is like poison, do not let it enter your heart because when it melts in your blood, you cannot set them apart!

وانەی ١٥١

**فێربوون لە دەست خۆتە؛ بۆیە بەدوای بیانوودا مەگەڕێ بۆ فێر نەبوون!**



**Learning** is your choice so do not look for pretexts not to learn!

وانەی ١٥٢

## لێبوردن گەورەترت دەکا؛ بۆیە لێی مەترسەو ئەنجامی بدە!



**Apologies** make you grow bigger so do not be afraid and do it!

وانەی ١٥٣

# زۆر کەس ئیرەیی بە دڵو دەروونی تۆ دەبەن؛ بۆیە دەبی سوپاسگوزار بی؛ بۆئەوەی کە ئێستا تۆ هەیتت!



**There** are many people who envy you because of your heart and psych therefore you need to be grateful for what you currently have!

وانەی ١٥٤

# لاساییکردنەوەی بێ گۆڕانکاری، ناچارت دەکا نواندن بکەی!



**Imitation** without any modification will force you to pretend!

وانەی ١٥٥

**هەرگیز خۆت لە پشت پلەو پایەو نازناوو بڕوانامە مەشارەوە؛ چونکە پێویستە تۆ ماناو گەورەیی بەوانە ببەخشی، نەک بە پێچەوانەوە!**



**Never** hide yourself behind posts, positions, family status and degree because you need to give value to these not the other way!

وانەی ١٥٦

## مرۆڤی ڕەسەن لەسەر گومان ناژی.



**Genuine** people do not live on suspicion.

وانەی ١٥٧

# پێویستە قەدری تاریکی بزانی، تەنانەت ئەگەر دەوروبەریشت ڕووناک بوو!



**You** should acknowledge the value of darkness even if you are surrounded by light!

وانەی ١٥٨

# ڕەشبینییو گومانکردن، وەک دوو نەخۆشیی گوزراوەن؛ بۆیە خۆت لە تووشبووان بە دوور بگرە!



**Pessimism** and suspiciousness are contagious diseases so protect yourself from the infected patients!

وانەی ١٥٩

# کەرو بارى نيشانەی ئاستی خاوەن کەرو خاوەن بارن!



**Donkey** and its load are signs of the level of the donkey owner and load-owner!

وانەی ١٦٠

## ئاگاداربە: فێڵ کۆدەبێتەوە پاشان بە یەک قست دەبی بیدەیەوە!



**Be** careful, deception is accumulated and then you have to pay it back all in one installment.

وانەی ١٦١

**دوورکەوتنەوە جیاوازە لە وازهێنان...هەندێک جار پێویست دەکا دوور بکەویەوە؛ تا خۆت کۆبکەیەوەو پاشان بەردەوام بی!**



**Stepping** back is different from quitting... sometimes you need to step back to collect yourself and go on later!

وانەی ١٦٢

# کارکردن لەگەڵ کەسانی نزمتر لە ئاستی خۆت تووشی بێئومێدیت دەکات؛ بۆیە خۆت بە دوور بگرە لێیان!

**Working** with people below your level disappoints you , thus it is better to keep away from them!

وانەی ١٦٣

## بۆئەوەی هاوڕێی باشت هەبی، دەبی بە خۆت هاوڕێیەکی باش بی بۆ کەسانی دی!



**In order** to have good friends, you have to be a good one for others!

وانەی ١٦٤

# هەرگیز بۆسە بۆ هەڵەی خەڵک دامەنێ؛ چونکە ڕۆژگاریش کامێرا بۆ هەڵەکانی تۆ دادەنێ!



**Never** ambush others' mistakes because time will put camera for your mistakes!

وانەی ١٦٦

**دیارییەکی گرانبەها بۆ دەوڵەمەندێک مەکڕە، کە پێویستی پێی نییە؛ چونکە شوێنی خۆی ناگرێت، بەڵکو دیارییەکی بچووک بدە بە کەسێک کە پێویستی پێیە!**



**Do not** buy an expensive gift for a rich man who does not need it because it will fill no gap, instead buy a small gift to someone who needs it!

وانەی ١٦٧

# ئەوەی ئەرکی خۆتە بیکەی، بە چاکە بەسەر خەڵکیدا مەیفرۆشەوە!



**Do not** sell to others what is your responsibility to do!

وانەی ١٦٨

**ئەگەر تا گەردنیشت خەم بێ، هێشتا مەجالی پێکەنینو چێژ وەرگرتن هەردەمینێ؛ بۆیە ئەو ساتانە لەدەست مەدە!**



**Even** if you are sank in grief, there is still room for enjoying and laughter so do not miss these moments!

وانەی ١٦٩

# بۆئەوەی خۆت لێ نەگۆڕێ، مەهێڵە دەوروبەرت بە ستایشکردن لێت نێزیک بکەونەوە!



**In order** not to change from your own eye, do not let people around you flatter you to get close to you!

وانەی ١٧٠

**چاوەڕێی بەخت مەکە کە لە دەرگات بدا، بڕۆ بە پشتبەستن بە کارامەییەکانی خۆت بەدوایدا بگەڕێ، داوەتی بکە بۆ ماڵەکەت!**



**Do not** wait for chance to knock at your door, based on your skills go search for it and invite it to your home!

وانەی ١٧١

# خۆ بە گەورەزانینو هەڵەشەیی دوو پەتای کوشندەن لە کارگێڕیدا!



**Arrogance** and making haste are two plagues in administration

وانەی ١٧٢

# ئەگەر ناچاربووی، کار لەگەڵ درۆزن بکە باشترە نەوەک لەگەڵ درۆزان!



**If** you were obliged, working with liars is better than with lie-expert!

وانەی ١٧٣

# لە بیر مەکە، خەڵک بە گەمژە زانین گەمژەییە.



**Remember**, to see people as stupid is stupidity!

وانەی ١٧٤

# لێمەگەڕێ کەس بتکاتە زمانحاڵی خۆی!



**Do not** allow anyone to make you his spokesperson.

وانەی ٥٠٥

## بۆ هەڵسەنگاندنی درووست، پشت بە پێوەری هەمیشەیی ببەستە، نەک پێوەری کاتیی!



**For** accurate assessment depend on permanent-lasting criteria not temporary ones!

وانەی ١٧٦

# هێندە بە کارو ڕووداوی لاوەکی خۆت خەریک مەکە، کاتت نەبێ بۆ کارو پڕۆژەی پڕبایەخ!



**Do not** busy yourself so much with secondary works and events that will leave you no time for works and projects of high value!

وانەی ١٧٧

# خۆت بەرپرسی لە خووو نەریتەکانت؛ بۆیە نابێ لۆمەی کەس بکەی.



**You** are responsible for your habits and traditions, you should not blame anyone!





وانەی ١٧٨

## هەموو کەتنەکانت مەیەخە ئەستۆی شەیتان؛ چونکە شەیتان فێڵت لێ دەکا، بەڵام خۆ ناچارت ناکات!

**Do not** attribute all your misconducts to devil because devil can deceive you but cannot force you!

١٧٩

# لەگەڵ جەستەو دەروونی خۆت باش بە...نە ڕق لە کەس هەڵگرە، نە خەم لە قسەی خەڵکی بخۆ!



وانەی ١٨٠

# هەوڵدە ڕێگە بگریت لە دڵشکاندنی ئازیزانتو ئەگەر کردیشت، زوو ئاشتیان بکەوە؛ چونکە شوێنی شکست زوو هەڵدەئاوسێ!



**Try** to prevent heart-breaking of your loved ones, if you did try to reconcile quickly because fracture gets inflammation soon!

وانەی ١٨١

# ژیان زۆر کورتترە لەوەی تێیگەیشتووی؛ بۆیە پەلە بکە لە بەخششەکانت!



**Life** is shorter than what you understood, so make your donations and giving as quick as possible!

وانەی ١٨٢

# پەپوولەش بی، خەڵک لێت دەبن بە دڕک؛ بۆیە هەر خۆت بە!



**Even** if you are a butterfly, people will become thorns, therefore always be yourself!

وانەی ١٨٣

# پەند لە ئاو وەرگرن: ڕوون بن وەک ئاوێنە!



**Take** lessons from water: be clear like mirrors!

وانەی ١٨٤

# جیاوازبوون خیانەت نییە، بەڵکو بەرپرسیاریەتیو ئەرکە!



**Being** different is not treason, it is responsibility and duty!

وانەی ١٨٥

# تواناکانی مێشکی مرۆڤ بێسنوورە؛ بۆیە تەلبەندی مەکە...مێشکت ئازادکە!



**Human** brain capacity is unlimited, so do not imprison it... liberate your mind !

وانەی ١٨٦

# فێرکردن، جۆرێکە لە فێربوون؛ بۆیە هەوڵ بدە کەسانی دی فێر بکەی!



**Teaching** others is another way of learning, hence try to teach others!

وانەی ١٨٧

## لە خۆت تووڕە مەبە؛ چونکە بەس تۆی هەیە!



**Do not** get angry at yourself because he has only you!

وانەی ١٨٨

# لۆمەکردنی کەسانی دی، گەمەیەکی دۆڕاوە؛ بۆیە بەشداری تێدا مەکە!



**Blaming** others is a lost game, therefore do not participate in it!

وانەی ١٨٩

**چاو، حاکمێکی نادادپەروەرو گوێ، شاهیدێکی کەڕە؛ بۆیە تەنها بە ئەقڵ حوکم بدە!**



**Eyes** are unjust juries, ears are deaf witnesses so only judge by your mind!

وانەی ١٩٠

# مرۆڤبوون پێویستی بە بڕیاردانو سووربوونو ئیرادەیە، ئەوانەش هەمووی لە دەست خۆتن.



**Being** human requires taking the decision, persistence and will, these are all in your hand!

وانەی ١٩١

# پەیامی پۆزەتیڤ بنێرە بۆ مێشکت، ئەویش بەو جۆرە ئیش دەکات.



**Send** positive signals to your brain, it will work in this way!

وانەی ١٩٢

# کلتوری لێبوردەیی لەگەڵ ناخی خۆتدا دەست پێ بکە؛ چونکە کە نەتوانی لە خۆت ببوری، ناتوانی لە کەسانی دی ببوری.



**Start** tolerance culture with your essence because if you cannot tolerate yourself you cannot do that with others!

وانەی ١٩٣

# هەوڵ بدە لە ژیاندا داوا لێ کراو بیت نەک داواکار!



**In** your life, try to become someone people request from not you request from others!

وانەی ١٩٤

**هەرگیز بە گاڵتە ئازاری کەس مەدە؛ چونکە ئەوان بەڕاستی ئازار دەچێژن.**



**Never** hurt others teasingly because they truly get hurt!

١٩٥

**ژیان وایە: هەندێک کات پشتگوێت دەخەن، دواتر هەر بەخۆیان پێویستیان بە تۆ دەبێت؛ بۆیە نە لە کاتی پشتگوێخستندا بێهاوا نە لە کاتی پێویستیدا بێمنەت بە!**



وانەی ١٩٦

**تەنها ئەو کەسانە لووتبەرز دەبن، کە دەزانن چەند کەموکورییان هەیە!**



**Only** those will be arrogant who know how many shortcomings do they have!

١٩٧

# دڵتەنگ مەبە بە ئازارەکانت؛ چونکە هەر ئازارێک تەمەنی مێشکت ئاستێک دەباتە پێشتر!



وانەی ١٩٨

## لە کارگێڕی سەرکەوتوودا: بەرپرس دەبی وەکی باوک بی، پێی خۆش بی ئەوانی ژێر بەرپرسیاریەتی ئەو لە خۆی ئاسوودەترو باشتر بن.



**In** successful management: the responsible person should be like father, who will be happy when people beneath his authority are happier and better than himself!

وانەی ١٩٩

# خەڵک ڕەنگە قسەکانت لەبیر بکەن، بەڵام ڕەفتارەکانت لەبیر ناکرێن!



**People** might forget your words, but they will never forget your behaviours!

وانەی ٢٠٠

# جۆری بیرکردنەوەو دونیابینیت، جۆرو شێوازی ژیانت دیاری دەکات.



**The** way you think and see life will determine your life style!

وانەی ٢٠١

**بیركردنەوەی كۆن، قەرزێكی گرانبەهایە لەسەر هەر تاكێك دەبێ بیداتەوە.**



**Old** thinking is a heavy debt that every individual should pay back!

وانەی ٢٠٢

# ئەگەر ویستت ئاستی هۆشیاریی کەسێک بزانی؛ ئەوا سەیری چۆنیەتی گفتوگۆکردنو هەڵسوکەوتی بکە لەگەڵ ئەوانەی بۆچوونی جیاوازیان هەیە.



**If** you want to know the intellectual level of someone, look at his way of talking and behavior with those who have different opinions with him!

وانەی ٢٠٣

**ئەوە ببەخشە کە دەتەوێت: زەردەخەنە، ئەوین، هاوڕێیەتی، پەروەردەو فێرکردن، ڕێز، وەفا، تەنانەت پارەش.**



**Give** those that you need: smile, love, friendship, education, respect, loyalty and even money!

وانەی ٢٠٤

## با ئاگاداری خووەکانمان بین؛ چونکە ژیانمان ڕەنگدانەوەی خووەکانمانە.



**Let** us take care of our habits because our lives are reflections of our habits!

وانەی ٢٠٥

# ئەگەر ویستت ژنێک فریو بدەی، بیر لە دایکو خوشکو هاوسەرو کچکەکەت بکەوە!



**If** you wanted to deceive a woman, think of your mother, sister, wife and daughter!

وانەی ٢٠٦

# هەرگیز هەوڵ مەدە بە ترس‌و تۆقاندن، ڕێزی خەڵک بەدەست بهێنی؛ چونکە ڕێزگرتنێکی کاتییە!



**Never** try to get other people's respect through fear because it will be temporary respect!

وانەی ۲۰۷

# دونیای فراوان سوودی چییە ئەگەر پێڵاوەکانت تەسک بێت!



**What** is the use of the wide world if your shoes are tight!

وانەی ٢٠٨

**کورسی سەرتاش، هەرجارەی کەسێک بۆ ماوەیەک لەسەری دادەنیشێ، بەڵام نابێتە خاوەنی ئەو کورسیەو دوکانو سەرتاشەکە، بە هەمان شێوە پۆستیش!**



**Every** now and then someone will sit on barber chair for some time but that person will never own the chair, not the shop and nor the barber, similar to posts and positions!

وانەی ۲۰۹

**هەر وشەو هەڵسوکەوتێک، نوێنەرایەتی بەشێک لە کەسایەتی تۆو پەروەردەی خێزانەکەت دەکات؛ بۆیە وریا بە!**



**Be** careful, every word and behaviour represents part of your personality and family education.

وانەی ٢١٠

## میزاجی بوون نیشانەیەکی سەرەکی نەخۆشیی دووڕوویی‌و دەمامکدارییە؛ بۆیە خەڵک بە گەمژە تێمەگە؛ چونکە ئەوان زۆر بەوردی ئەوە دەبینن.



**Moodiness** is the primary sign of hypocrisy and mask-wearing disease, do not see people like stupid because they see everything clearly!

٢١١

لە دەوروبەرت کەسانی زیرەکتر لە تۆ هەن، بەس وەک نازیرەک هەڵسوکەوت دەکەن.

پێویستە جارجار لە خۆت بپرسی بۆ وایە؟



وانەی ٢١٢

**ناکرێ باری 'کەر' لە 'بزن' بار بکەی؛ چونکە خۆتو بزن شەرمەزاری خاوەن بار دەبی!**



**You** cannot load a goat with a donkey load because you and the goat will be embarrassed to the load-owner!

وانەی ٢١٣

**مرۆڤەکان ئەگەر لە ڕادەی خۆیان زیاتر گەورەیان بکەی تێکدەچن، ئەگەر مریشک زۆر پوف بدەی هەوڵدەدا هێلکەی قاز بکا، بەمەش زیان بە خۆیو خاوەنەکەی دەگەیەنێ!**



**Human** beings get rottenifthey are excessively grown. Similarly, if you blow wind into chicken it will try to lay goose egg consequently he and the owner will be losers

وانەی ٢١٤

**دوور بڕوانە: کەسایەتی خۆت بۆ خۆخۆشەویستکردن لای کەسانی سەرووی خۆت لەدەست مەدە؛ چونکە نە ئەوان تا سەر لە سەروو دەمێننەوە، نە تۆش هەروا زەلیل!**



**Look** far: do not lose your personality just to make yourself look lovely to people above you because neither they stay above for good nor you stay so low!

وانەی ٢١٥

**ئەگەر ویستت لە کەسێک بدەی، گەمژەییە لە خاڵی بەهێزی دەست پێ بکەی؛ چونکە نەک هەر سەرکەوتوو نابیت، بەڵکو ڕیسواش دەبی!**



**If** you want to beat someone, it will be stupid to start from his strong points because you will not only fail but be embarrassed as well.

333

٢١٦

بۆئەوەی کەسێکی سەرکەوتوو بی، دەبی سەرەتا خاوەنی خۆتو بڕیارەکانت بی، نەک بووکەڵەی دەستی ئەمو ئەو.



وانەی ٢١٧

**هەرگیز فرمێسکو ئازاری کەسانی دی مەکە خۆراکی خەندەکانت!**



**Never** feed others' tears and pains to your smiles!

وانەی ٢١٨

# ئەگەر زانست لە سینەتدا حەپس بکەیو ڕێ لە بڵاوبوونەوەی بگری؛ ئەوا سزات دەدا!



**If** you imprison knowledge within yourself and prevent its spread, it will penalize you!

وانەی ٢١٩

# ئەگەر بتەوێ سەرکەوی، دەبی بزانی چۆن ناکەوی!



**If** you want to succeed, you should know how not to fail!

وانەی ٢٢٠

**ئەگەر ڕاوێژ بە کەسانی لە خۆت بە ئەزموونتر نەکەی، تووشی هەڵە دەبی؛ چونکە ئەوان بەو هەڵانەدا تێپەڕیوون!**



**If** you do not consult who has more experience than yourself, you will make mistakes because they have gone through these mistakes!

وانەی ۲۲۱

## ئەوەی نەتوانێ لەژێر فشاردا بڕیاری درووست بدا، نابێتە سەرکردەو پێشەنگ!



**Those** who cannot make sound decisions under pressure will not become leaders or role models!

وانەی ٢٢٢

# متمانەی کوێرانە بە کەس مەکە؛ چونکە مرۆڤو ژیان لە گۆڕانی بەردەوامدان!



**Do not** put your blind confidence in anyone because humans and life are continuously changing!

وانەی ٢٢٣

# ئەوەی شیری پێدای، تیری تێ مەگرە!



**Do not** through arrow at those who fed you milk!

وانەی ٢٢٤

# هەندێک جار بۆ پاراستنی ڕێزی خۆت، پێویست دەکا هەندێک کەس لە ژیانت بسڕیتەوە!



**Sometimes** to preserve your respect, it would be necessary to erase some people from your life!

٢٢٥

# هەوڵ بدە خۆت بە دوور بگرە لەو کەسانەی جوێنو قسەپێ گوتنی سەرووی خۆیان وەک مەرهەم دەبینن!



٢٢٦

# زۆر جار ئامانجی تۆ سەرووترە لە ئاستی تێگەیشتنی خاوەن کارەکەت؛ بۆیە نە تێت دەگات نە لێت دەگەڕێ!



# ژیانی تۆ یەکسانە بە بڕیارو هەڵبژاردنەکانت، نەک ویستو ئارەزووەکانت!



وانەی ٢٢٨

# دەست لە پشتدانی نەیاران جیاوازی نییە لەگەڵ ڕاوەشانی چوولکەو داران!



# Commending

the act of your enemies does not differ from your attack with stick!

وانەی ٢٢٩

# گەر دەتەوێ خۆت بناسی، سێڵفی ناخت بگرە، نەک ڕوخسار!



**If** you want to know yourself take a selfie of your inner side not your face!

# هەرچەند منداڵیی خۆت تفتو تاڵ بێت، نەکەی گەرای بوغزو کینە لە دڵدا دانێیت!



وانەی ٢٣١

# خەندە بۆ فریودان بەکارمەهێنە؛ چونکە خەندەی ساختە جێی متمانە نییە!



**Do not** use smile to deceive others because fake smiles are not dependable!

٢٣٢

# چۆن تۆ مافت هەیە هاوڕێیەکانت هەڵبژێری، کەسانی تریش هەمان مافیان هەیە؛ بۆیە ناکرێ خۆت لەو کارە هەڵبقورتێنی!

وانەی ٢٣٣

# زللەی خۆبەزلزانین، هێندەی زەمین لەرزەیەک زەرەرەی هەیە!



**Slap** of arrogance is as harmful as an earthquake.

٢٣٤

# سیخوڕیکردن بەسەر هاوپیشەکانت، بە کوێرەڕێیەکت دادەبات نە دەتوانی پێیدا تێپەڕی نە بگەڕێیەوە!



وانەی ٢٣٥

**بۆئەوەی لە کارگێڕیدا سەرکەوتوو بی: یەکەم وتەت بۆ هاوکارانت با بریتی بێت لە 'دەزانم من لە هەمووتان باشتر نیم، بەڵام پێکەوە دەتوانین باشترین ئەنجام بدەین' و بە کردار جێبەجێی بکە!**



**In order** to be a successful administrator, let your first words be 'I know I am not better than all of you but together we can do the best' and apply this in action.

وانەی ٢٣٦

# نیازی تۆ گرنگە نەک تێگەیشتنی ئەوان؛ بۆیە بە متمانەوە بەردەوام بە!



**Your** intention is more important than their understanding, so continue with confidence.

وانەی ٢٣٧

**بۆئەوەی وشەكانت بیستراو بن؛ لە هەموو شوێنێک، هەموو كاتێک، بۆ هەموو كەسێک قسە مەكە!**



**For** your words to be heard, do not speak in every place, all the time and to all people.

وانەی ٢٣٨

## مرۆڤی ڕەسەن بە دڵخۆشبوونو سەركەوتنی كەسانی دی شادو ئاسوودە دەبێت.



**Genuine** people become happy and comfortable when they see others' happiness and success.

وانەی ٢٣٩

# مرۆڤەکان بێدەسەڵاتن؛ چونکە ناتوانن ڕێگە لە پیربوونی دایکو باوکی خۆیان بگرن!



**Human** beings are weak because they cannot prevent their parents from aging!

وانەی ٢٤٠

# لە کارگێڕی سەرکەوتوودا، ڕەتکردنەوەی داواکاریش بە شێوازێکی گونجاوو بەڕێزەوە ئەنجام دەدرێت، نەک بە پێچەوانەوە!

**In** successful administration, even rejecting requests will be conducted with respect and appropriately not the opposite!

وانەی ٢٤١

# لە هەر شوێنێک مووچە بوو بە نووچە، ژیان تێیدا پووچە!



**The** place where salary becomes the news, there life will be absurd!

وانەی ٢٤٢

## ئەوەی نەبوونی بینیبێت، زیاتر قەدری بەخشین دەزانێت!



**Those** who have seen poverty value donations better!

٢٤٣

# ئاسوودەیی لە ماڵێکی گەرمو گیرفانێکی پڕدا نییە، بەڵکو لە ئەقڵێکی پڕو دڵێکی گەرمدایە!



وانەی ٢٤٤

# یاری دڵشکاندن لەگەڵ کەسدا مەکە؛ چونکە ئازارەکان ڕاستەقینەن!



**Do not** break hearts as joke because pains are real!

333

٢٤٥

# هەندێک جار لەدەستدان یەکسانە بە قازانج، بۆ نموونە: برادەرو خووی خراپ!



وانەی ٢٤٦

# پڕ بژیو
# بەتاڵ بمرە!



**Live** full and die empty!

وانەی ٢٤٧

# بیرکردنەوەی ئەرێنی کلیلێکە دەرگاکانی مێشک دەکاتەوە!



**positive** thinking is a key that opens doors of your brain!

٢٤٨

**له یاری تۆپی پێدا، ئەگەر یاریزانێک له گێمی یەکەم خۆی زۆر هیلاک بکا، بۆ گێمی دووەم هێزی وەک جاران نامینێ... ژیانیش وایه!**



وانەی ٢٤٩

# خوێندنەوە، گەشتکردنە بە نێو ئەزموونی کەسانی دی... چەندی پتر گەشت بکەی زۆرتر فێر دەبی!



**Reading** is traveling through others' experiences... the more you travel, the more you learn.

وانەی ٢٥٠

# باوەش بۆ یەکتری بکەنەوە نەک باوەشێن لە ئاگری ڕقو تۆڵە بکەن.



**Open** your arms for each other instead of fanning the fire of hatred and revenge!

وانەی ٢٥١

# خاکیی بە...لە دڵەوە پێبکەنە ...ئەوانی دی بخە پێکەنین؛ چونکە ژیان لە گۆڕاندایە



**Be** modest, laugh from the heart, make others laugh because life is changing!

وانەی ٢٥٢

**پێویست ناکا بۆ هەموو کەس بسەلمێنێ کە تۆ چەند باشی. هەندێک جار هەوڵدان بۆ خۆسەلماندن دەچێتە خانەی خۆکەمکردنەوە!**



**There** is no need to prove your goodness to everyone, sometimes trying to prove yourself could be belittling yourself!

وانەی ٢٥٣

# لە بیر مەکە، قەت ڕێگای نادرووست مەگرەبەر بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی درووست!



**Do** not forget, never try incorrect route for getting to a correct goal!

وانەی ٢٥٤

## زانیاری هەڵە بکەیتە بنەمای بڕیاردان، هەموو کات دەرئەنجامەکانت خراپ دەبن!



**If** you base your decisions on false information, your results will always be bad!

وانەی ٢٥٥

**درۆ خراپە، بەس درۆكردن بە دەمی زانست، خراپترین جۆری درۆیە.**



**Lying** is bad but lying about science is the worst type!

وانەی ٢٥٦

## هەرگیز ڕێگە مەدە سپڵەیی و دووڕوویی و نادیدەیی هەندێک کەس وات لێ بکات بڕیاری خۆ دابەزاندن بۆ ئاستی ئەوان بدەیت!



**Never** let ingratitude, hypocrisy of some people make you decide to take yourself to their low level!

وانەی ٢٥٧

# گەورەیی کەسێتی خۆت مەخە بەرامبەر بچووکی ئەقڵی ئەوان!



**Do not** equalize your great personality to their small mind!

وانەی ٢٥٨

# هەندێ جار ناچار دەبێ بەسەر هەڵەکاندا پازبدەی!



**Sometimes**, you will be forced to jump over the mistakes!

وانەی ٢٥٩

# لە بیر مەکە 'دەسکەلا'بوون لە کارگێڕیدا، هۆکارێکی سەرەکی هەرەسهێنانی دامەزراوەکانە.



**Do not** forget, being someone else's 'hitting-marble' is the main reason for your institutions collapse.

وانەی ٢٦٠

**هەندێک جار یەک وشە بارتەقای کتێبێک هەستو سۆز دەبەخشێت وهەندەک جاریش هەر یەک وشە دونیات لێ سەراوبن دەکات...بۆیە دەبی زۆر وریای وشەکانمان بین.**



**Sometimes**, one word speaks out a book of emotions and feelings and one word can turn your world upside down...hence, we have to be aware of our words!

وانەی ٢٦١

# خاکیی بوون ... ڕەفتارە نەک گوتار.



**Being** modest is an act not a word!

وانەی ٢٦٢

# خاکیی بوون هەموو گومانێک دەرەوێنێتەوە.



**Modesty** moves away all suspicions!

وانەی ٢٦٣

# خاکیی بوون لە مرۆڤبوون نێزیکت دەکاتەوە.



**Modesty** gets you closer to being human.

وانەی ٢٦٤

**بۆئەوەی ئاسوودە بی، باوەڕ بەوە بکە کەسی لە تۆ باشتر لە دونیادا هەیە.**



**To** be happy, believe that there are better people than you in this world!

وانەی ٢٦٥

## بەدوای ئەو هاوڕێیەدا بگەڕێ
## کە پەرت بووی، کۆتدەکاتەوە!



**Search** for a friend who will collect you when you are spread!

وانەی ٢٦٦

# ئەگەر پێت کرا چاکە لەگەڵ دوژمنیشت بکە؛ چونکە هەر دێتەوە ڕێگات!



**If** you could do favor even with your enemies because it will come back to your route.

وانەی ٢٦٧

**کەس لە خۆڕا نەهاتۆتە ژیان؛ بۆیە تا لە ژیانداى کار بۆ ئامانجەکانت بکە.**



**No** one has been created in vain, so work for your objective while you are alive!

وانەی ٢٦٨

# زمانی مرۆڤ ناسنامەیەتی بۆیە هەرگیز گاڵتە بە هیچ زمانێک مەکە!



**Language** is the identity of human beings so do not make fun of any language!

وانەی ٢٦٩

# دڵی مرۆڤ دەرگایە بۆ مێشکی بەڵام گەدەی دەرچەی تەنگەتاوی!



**Human** heart is the door to his mind but his stomach is an emergency exit!

وانەی ٢٧٠

## لە بری تەرمی گوڵ، گوڵو گوڵدان بکە دیاری!



**Instead** of the corpse of flowers, let us make flower in vase our gifts.

وانەی ٢٧١

# سەرکەوتن، ماندووبوون دەرەوێنێتەوە.



**Success** removes tiredness.

وانەی ٢٧٢

**تا زیاتر خەڵکت خۆش بوێ، خۆشەویستتر دەبیت.**



**The** more you love people, the lovelier you would be.

وانەی ٢٧٣

# بڵاوکردنەوەی وێنەی خۆت لەگەڵ بەرپرسانو وێنەی خوانی خواردن، گومان دەخاتە سەر شێوازی بیرکردنەوەت!



**Posting** your photo with officials and your meals to the public adds suspicion to your way of thinking.

وانەی ٢٧٤

# ڕێزگرتنی مامۆستاكانت، نیشانەی پەروەردەی درووستی خێزانەكەتە!



**Respecting** your teachers is a sign of your proper family education.

٢٧٥

# منداڵ هێندەی بە لاساییکردنەوە فێردەبێت، نیو هێندەش بە پێگوتن فێر نابێت؛ بۆیە ئاگاداری هەڵسوکەتت بە لە بەرچاوی منداڵان!



وانەی ٢٧٦

**ئەوەی لەبەر ترس ڕێزی کەسێک بگرێ؛ ئەوا هەرگیز ڕێزی خۆی نەگرتووە!**



**The** person who respects someone out of fear has never respected himself/herself.

٢٧٧

# لەخۆباییبوونو لاف لێدان لەسەر کەسانی ژێر بەرپرسیاریەتی خۆت نیشانەی بێهێزیی تۆیە!



وانەی ٢٧٨

# ئەوەی بە کەم ڕازی نەبێت بە زۆریش ڕازی نابێت!



**He** who is not satisfied with little, will not be satisfied by more.

وانەی ٢٧٩

**چاوەڕێیی بە ئازارە؛ بۆیە تا پێت دەکرێ کەس لە چاوەڕێییدا مەهێڵەوە!**



**Waiting** is painful so do not make others wait as much as you can!.

وانەی ٢٨٠

# چۆن گوڵ، بێ ئاو سیس دەبێ، دڵیش بێ خۆشەویستی!



**The** way flowers fade without water, similarly the heart with no love!

وانەی ٢٨١

**ئەقڵی مرۆڤ گەنجینەیە؛ تا بۆ چاکە بەکاری بهێنی، هەر کە وەستای لە بەکارهێنانی دەبێتە بار!**



**Human** brain is a treasure as long as you use it for good deeds, the moment you stop, it becomes a burden.

٢٨٢

# بە بینینی نادادیو ناهەقی لە شوێنی کار نابێت لە ئامانجو پەیامی پیرۆزی خۆت سارد ببیەوە!



وانەی ٢٨٣

**ئەگەر هیچ چاکەیەکت پێ ناکرێ، بەس مەبە ماشەی دەستی کەس.**



**If** you cannot do any good deeds, it is enough not to be anybody's hurting arm!

وانەی ٢٨٤

# زانیاری نادرووست بڵاوکردنەوە، بێقەستو بە ئەنقەست، دەچێتە خانەی ناڕاستگۆیی!



**Spreading** false information, unintentionally or intentionally, is considered lying!

وانەی ٢٨٥

**هەور كە ئاوس بوو هەر دەبێ بزێ، نەک لەبەرئەوەی حەز دەكا، بەڵكو چونكە پێویستی بە ئاوس بوونێكی ترە!**



**When** clouds get pregnant, they need to deliver not because they like it but because they need to get pregnant again!

وانەی ٢٨٦

# مێشکی مرۆڤ چاوەڕێی داتای ڕۆژانە دەکات، چی بۆ بنێری بەرهەمەکەشی لە توخمی داتایەکان دەبێت!



**Human** brain waits for daily input, whatever the input is the output will be of similar data category!

وانەی ٢٨٧

# هەرگیز دڵتەنگ مەبە بە ڕەخنەی هاوڕێیەکانت، ئەوان یان خەمی تۆیانە یان خەمی خۆیانە!



**Never** get upset when friends criticize you, they either want your favor or their own!

وانەی ٢٨٨

**مرۆڤەکان بە شێوەیەکی زگماک باشن و یارمەتیدەرن؛ بۆیە لەسەر ئەو بنەمایە مامەڵەیان لەگەڵ بکە!**



**Human** beings are innately good and helpful, so treat with them on this basis.

وانەی ٢٨٩

# ئەوەی شەرم لە درۆ نەکات
# باکی بە هیچ گرەوێک نییە!



**He** who does not feel shy to lie will have no problem in making any bet!

٢٩٠

# چۆن کەمتیار تام لە کەلاک دەکا نەک گیانداری زیندوو، مرۆڤەکانیش هێندە متووی مردووەکانن، زیندووەکانیان پشتگوێ خستووە!



وانەی ۲۹۱

## بۆئەوەی ئاسوودە بی، زانیاری نادروست لەبارەی خۆت ڕەت بکەوە، تەنانەت ئەگەر ئەرێنیش بوو!



**In order** to be happy, reject false information about yourself even if they were positive!

وانەی ٢٩٢

# داشۆران لە مرۆڤبوون، گەورەترین سزای سەر زەمینە؛ بۆیە با ئامانجی ژیانت بۆ مرۆڤبوون بێت!



**Detachment** of humanity is the greatest punishment on earth so let your life objective be being human!

وانەی ٢٩٣

**سەرکەوتنی تۆ، بەندە بە ئیرادەو شێوازی بیرکردنەوەی تۆ!**



**Your** success is based on your will and way of thinking.

وانەی ٢٩٤

**کەسانێک هەن هەتا لێیان دوورنەکەوینەوە، نازانین چەند زەرەریان لێ داوین!**



**There** are people that you need to get away from them to know the extent of harm they did to you!

وانەی ٢٩٥

# هەموو هەڵسەنگاندنێک ڕەنگە درووست نەبێت؛ بۆیە هەرگیز بە یەک هەڵسەنگاندن لەخۆبایی یان بێئومێد مەبە!



**All** assessments might not be correct, so never get arrogant or disappointed with one assessment!

وانەی ٢٩٦

**لە بیرت بێ پۆستو پێگە کاتین؛ بۆیە دەبی بیر لە خۆتی بێ پۆستو پێگە بکەیەوە!**



**Remember** posts and positions are tentative therefore you need to think of yourself without posts and positions!

وانەی ٢٩٧

# بۆ ئاسوودەیی دەروون، ڕوخسارت لە پێکەنین بێبەش مەکە!



**For** peace of mind, never deprive your face from laughing.

وانەی ٢٩٨

## بۆئەوەی ئاسوودە بی،
## تۆوی متمانە بچێنەو لە
## ئەنجامەكەی ڕابمێنە!



**To** be happy, plant seeds of trust and see the results.

وانەی ٢٩٩

# ئەو کەسەی بە ' من، من' قسان بکات 'نم نم' دەتوێتەوە!



**The** one who speaks with 'I, I' will melt drop after drop!

وانەی ٣٠٠

**مەرج نییە وەڵامی چاکە بە چاکە بدەیە، بەڵکو ئەوەندە بەسە نکوڵی لە چاکەکە نەکەیو لەبەرچاوت بی!**



**It** is no necessary to reward a favour with another one, it is enough not to deny and just acknowledge it.

وانەی ٣٠١

**بۆئەوەی ئاسوودە بی، دڵی کەسانی تر خۆش بکەو دڵخۆشبوونی کەسانی ترت پێ ناخۆش نەبی!**



**To** be happy, make other happy and do not get upset when others are happy.

وانەی ٣٠٢

# بۆئەوەی ئاسوودە بی، بەهای خۆت بزانە ...کارێک مەکە لە بەهای مرۆڤبوونت کەم بکاتەوە!



**To** be happy, know your value... do not do anything to belittle your human value.

وانەی ٣٠٣

# بۆئەوەی ئاسوودە بی، هەر کارێک ئەنجام دەدەیت ڕەچاوی (هەستی) کەسانی تر بکە.



**To** be happy, take other people's feelings into consideration when you do anything.

وانەی ٣٠٤

**بۆئەوەی ئاسوودە بی، خەندە بچێنە ئەگەر پێت ناکرێ پێی لێ مەنێ!**



**To** be happy, plant smile if you could not do not step on it.

وانەی ٣٠٥

**هاوکاریکردنی کەسێک پێویستی پێیەو پێت نالێت، زۆر گەورەترە لەوەی پێویستی پێ نییە، بەڵام تۆ بۆ خۆدەرخستن دەکەیت!**



**Helping** someone who needs help but does not tell you is much greater than helping someone who does not need but you do it to show off.

وانەی ٣٠٦

**ئەوەی لە دڵو ناخدا بی، ڕوخسار ناتوانێت تا سەر بیشارێتەوە!**



**Whatever** is found in the heart and essence, faces cannot hide forever.

وانەی ٣٠٧

# سامانی مرۆڤ بەهاکانیەتی نەک بەهانەکانی!



**Human** fortune is his values not his excuses!

وانەی ٣٠٨

# بێ دەنگیی دۆستان بە ئازارترە لە وشەی دوژمنەکان!



**The** silence of friends is more painful than the words of the enemy.

وانەی ٣٠٩

# خۆویست مەبە، بەڵام خۆت خۆش بوێ!



**Do not** be selfish but love yourself.

وانەی ٣١٠

# جۆری هەویر بە هەوێنەکەی دەردەکەوێت...مرۆڤیش بە پەروەردە!



**The** quality of the dough is known by the yeast and that of human by education.

وانەی ٣١١

# بێئومێدبوون، تواناکانت دەپووکێنێتەوە!



# Disappointment

fades away your capabilities.

وانەی ٣١٢

**متمانە کۆدەکرێتەوە؛ بۆیە پەلە مەکە!**



**Trust** is accumulated, so do not make haste.

وانەی ٣١٣

**گەشبینەکان بەردەوام سەرکەوتن دەبینن؛ چونکە لە ئەزموونەکان وانە فێر دەبن، نەک ئومێد لە دەست بدەن!**



**Optimistic** people always succeed because they learn lessons from experiments not get disappointed.

وانەی ٣١٤

# ئەگەر کەسێک بێڕێز بوو بەرامبەرت...هەرگیز خۆت مەهێنە ڕیزی ئەو؛ چونکە دەبێتە سەرکەوتن بۆ ئەوو دۆڕان بۆ خۆت!



**If** someone was disrespectful with you... do not take yourself to his level because he will win and you will lose!

٣١٥

**ئەگەر کەسێک دووڕوو بوو لەگەڵت...هەرگیز خەم مەخۆ، ڕۆژێک دێت خۆی ڕووەکانی خۆی لێ تێکەڵ دەبێتو خۆی خۆیت بۆ ئاشکرا دەکات!**



وانەی ٣١٦

# ئەگەر کەسێک خۆبەزلزان بوو...هەرگیز نیگەران مەبە، چونکە ڕۆژێک دێت خۆی بەتاڵبوونی خۆیت بۆ دەردەخات!



**If** someone was arrogant and self-important... never get upset because someday he will reveal his emptiness!

وانەی ٣١٧

**هەوڵ بدە ئاسوودەیی لە ناخی خۆتدا بدۆزەوە، ئەو کات دەتوانی بە ئاسوودەیی لەگەڵ کەسانی تردا بژیت!**



**Try** to find peace of conscience within yourself, then you can live peacefully with others!

وانەی ٣١٨

**لە خۆت تێبگە؛ تا بتوانی لە خەڵکی تر تێبگەی!**



**Understand** yourself so that you understand others!

وانەی ٣١٩

**ئەوەی بە دوای مرۆڤبووندا بگەڕێت، ڕێگاکانیش بەدوای ئەودا دەگەڕێن!**



**Those** who search for being human, ways also look for him!

وانەی ٣٢٠

# کاتێک پێکەنین لە ناخەوە دێتەدەرێ، هەموو دونیا هەستی پێ دەکات!



**When** laughter comes out from your essence, the entire world will feel it!

وانەی ٣٢١

**ئەگەر توانیت دڵی کەسێک خۆشکەی، ئێستا بیکە؛ چونکە ڕەنگە دووبارە دەرفەتت بۆ نەڕەخسێت یان ئەو کەسە چیتر پێویستی پێ نەبێت!**

**If** you could make someone happy, do it now because you may not get a second chance or that person might not need it anymore!

٣٢٢

# بۆئەوەی ئاسوودە بی، 'هەموو مرۆڤێک باشە؛ تا خراپە دەکات' بکە دروشمی ژیانت.



وانەی ٣٢٣

**خۆت باشتر خۆت دەناسی؛ بۆیە ڕێگە مەدە کەسی تر وێنای تۆ بۆ دەوروبەرت بکات!**



**You** know yourself better, so do not let anyone to portray you for your surrounding!

وانەی ٣٢٤

**خۆری ڕاستی هەر هەڵدێت، بەڵام گرنگە تۆ کەیو لە کوێ پێی دەگەیت!**



**The** sun of truth will appear but it is important when and where you reach it!

وانەی ٣٢٥

**بە هۆی بێزاربوونی خۆت، نەفرەت لە گوڵ مەکە، بەڵکو هەوڵ بدە خۆت چاک بکەیەوە!**



**Due** to your being upset, do not damn the flower, try to mend yourself instead

٣٢٦
یاری 'دڵشکاندن' لەگەڵ کەس مەکە بۆ پێکەنینێکی کاتیی؛ چونکە 'شکان'ی دڵ بە لێخۆشبوون و پەشیمانی چاک نابێتەوە!



٣٢٧

# ئەوەی توانای درووستکردنی خەندەی هەبێتو نەیکات، وەک ئەوەیە کە ڕێگر بێت لە کاری چاک!



وانەی ٣٢٨

# لێبوردە بە لەگەڵ خۆتو خەڵکی؛ تا ئاسوودە بی!



**To** be happy, be tolerant with yourself and others

وانەی ٣٢٩

# بۆئەوەی لە مرۆڤبوون نێزیک بکەویەوە، پێویستە لە هۆگربوون بە خۆت دوورکەویەوە!



**In order** to get closer to being human, you have to move away from self-addiction!

# بۆ گەیشتن بە ئامانجی سەرەکی، پێویستە پێ لەسەر هەندێک وردەئامانج دابنێی!



وانەی ٣٣١

# بۆ ناسینی، کەسێک سەیری رێی بکە نەک ڕووی!



**To** know someone look at his path not his face!

وانەی ٣٣٢

**گلەیی لە کەس مەکە، ڕابردووی تۆ هەوێنی ئەمڕۆی تۆیە....ئەمڕۆت دەبێتە هەوێنی سبەی تۆ!**



**Do not** blame anyone your past fosters your today... your today will foster your tomorrow!

وانەی ٣٣٣

# بۆ ئەوانەی دەیانەوێت بگرین لە لات، 'شان' بە نەک بڵندگۆ!



**Be** a shoulder for others to cry on and not an amplifier !



## د.هیمداد عبدالقهار محمد

- ✓ پرۆفیسۆر لە زمانی ئینگلیزیو زمانەوانی- زانکۆی سەلاحەدین.
- ✓ مامۆستای زانکۆو توێژەرو نووسەرو وەرگێڕو ڕاهێنەری گەشەپێدانی مرۆیی.
- ✓ شەش کتێبی بە چاپ گەیاندووە.
- ✓ زیاتر لە ٦٠ بابەتو لێکۆڵینەوەی نووسیوەو وەرگێڕاوە بۆ سەر زمانی کوردیو ئینگلیزی.
- ✓ ٢٢ توێژینەوەی ئەکادیمی لە گۆڤارو کۆنفرانسی ناوخۆییو نێودەوڵەتییەکان بڵاوکراوەتەوە.
- ✓ سەرنووسەری گۆڤاری ( سەکۆ - لە نێوان زانکۆی سەلاحەدینو زانکۆی سینسیناتی ئەمەریکی)و ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری ئەکادیمی/ ئەکادیمیای کوردیو سەرنووسەری گۆڤاری کۆزانو ئیدتەر لە ڕۆژنامەی کوردیش گڵۆب بە زمانی ئینگلیزی بووە.
- ✓ ڕیڤیوەر لە کۆنفرانسی زانستیی دوبەی.
- ✓ ڕیڤیوەر لە کۆنفرانسی TESOL .
- ✓ ئەندامی یەکێتی مامۆستایانی ئینگلیزی جیهانی IATEFL.
- ✓ ئەندامی یەکێتی زمانەوانانی ئەوروپا.
- ✓ سەرۆکی تۆڕی مامۆستایانی ئینگلیزی کوردستان.
- ✓ سەرۆکی ئەکادیمیای مێگامایند پڵەس بۆ پەروەردەو ڕاهێنانو ڕاوێژکاریی.

himdad.muhammad@su.edu.krd